# خوێندنەوەی کوردی
# ئەلف و بێی قادرمە

## بناغەیەکی بەهێز و ئاسان
## بۆنەهێشتنی نەخوێندەواری

### قۆناغی یەکەم



# خوێندنەوەی کوردی

# ئەلف و بێی قادرمە

## بناغەیەکی بەهێز و ئاسان

## بۆنەهێشتنی نەخوێندەواری

## قۆناغی یەکەم



## پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، کە توانیم بە پشتیوانی ئەو، ئەم پەرتووکەی بەردەستتان بە بەشێوازێکی پەیژەیی ئاسان دابڕێژم, وەکوو نموونەی قادرمە لە پلەی خوارەوە بەرەو پلەکانی سەرووتر, هەنگاو بە هەنگاو قوتابی پێیدا سەردەکەوێت، ئەمەش بۆ ئەوەی قوتابی سەری لێنەشێوێت و بەکاتێکی کەم و دیاریکراو ڕێگای فێربوونی خۆی بە ئاسانی بزانێت.

گومان لەوەدا نییە، کە نەخوێندەواری دەردێکی کوشندەیە و هۆکاری دواکەوتنی وڵاتە لە هەموو کایەکانی ژیان" زانستی، کۆمەڵایەتی، ئابوری..هتد منداڵان سەرچاوەی ڕاستەقینەی گەشەسەندنی نەتەوەن و پاشەڕۆژی هەرنەتەوەیەک پەیوەستە بە چۆنیەتی پەروەردەکردن و ڕۆشنبیرکردنی منداڵان. بۆیە هەوڵدان بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی چەکدار بە زانست و مەعریفە، پێویستییەکی شەرعی و نیشتمانییە.

ئەم پەرتووکە بەشێوازێکی مام ناوەندی داڕێژراوە، نە قوتابی ماندوو دەکات و نە مامۆستا، ئەم پەرتووکەی بەردەستتان لەسەر پێنج بنەمای سەرەکی داڕێژراوە، کەئەمانەی لای خوارەوەن:

( خوێندنەوە – نووسینەوە – ڕێنووس – خۆشنووسی – خوڕەوشتی بەرز و جوان ) نهێنی فێربوون لەم پەرتووکەدا لە ( ٣٢ ) پیتی سەرەتایی پەرتووکەکەدایە، کە دەبێت قوتابی بەئاستێکی زۆر چاك فێری ببێت. ئەگەر وا نەبێت ئەنجامی باشی نابێت . بیرۆکەی دانانی ئەم پەرتووکە لە سێ بەرگ پێك هاتووە بۆ پۆلەکانی یەکەم دووەم سێیەمی بنەڕەتی و نەهێشتنی نەخوێندەواری بەشێوەزارەکانی کرمانجی و سۆرانی لەگەڵ سیدییەکی فێرکاریدا و بەپشتیوانی خودا لەداهاتوو بەئەپلێکێشن بە شێوازێکی زۆر پێشکەوتوو پشتگیری ئەم پەرتووکە دەکەم, بۆئەوەی بەئاسانی بگاتە بەردەستی قوتابییان و سوودی زیاتری لێوەرگرن، بەڵام ئەوەی ئێستا لەبەردەستتدایە کورتکراوەی ئەم سێ بەرگەیە، کە بۆ هەموو کوردزمانێك پێویست و سوود بەخشە. بەشیوازی فۆلکلۆری کوردی دیزاین و ئامادەکراوە و وەکو سەرەتایەك بلاوم کردۆتەوە. ئەگەر دەزگایەکی پەروەردەیی داوام لێبکات ئامادەم هاوکاری بکەم. بەپشتیوانیی خودا ئەوەی ماوە بۆ داهاتوو. لەکۆتاییدا داواکارم لەخودا یارمەتیدەری دونیا و دوارۆژم بێت. سوپاس بۆ ئەوکەسانەی کە یارمەتیان داوم


مامۆستا کامران تحسین مستەفا

قوتابخانەی/ ڕەوشەنی بنەڕەتی هەولێر

٠٧٥٠٤٣٥ ٤٢ ٦٨

## بۆمامۆستایانی بەرێز:-

پەرتووکی ئەلف و بێی قادرمە بۆ فێربوونی (خوێندنەوە و نووسین )بەزمانی کوردی .

گەر خودا یار بێت سوودی بۆ هەموو کەسێك دەبێت،کەحەزبکات فێری نوسین و خوێندنەوەی زمانی کوردی ببێت،بەبناغەیەکی بەهێز و بەخێراییەکی زۆر

بە پێی ئەم خشتەیە گونجاوە. بۆ هەموو تەمەنێک

١- تەمەن ( ٥ ) سالّی تەنیا ( ٣٢ ) پیتی سەرەتای پەرتوکەکە واتە (کۆمەڵەی یەک پیتی ).

٢- تەمەن ( ٦ ) سالّی کۆمەڵەی یەک پیتی تاکو کۆمەڵەی ( ٦ ) پیتی .

٣- تەمەن ( ٧ ) سالّی کۆمەڵەی یەک پیتی تاکو ڕستەسازی پێنج ڕستەیی.

٤- تەمەن ( ٨ ) سالّی کۆمەڵەی یەک پیتی تاکو کۆتایی پەرتووکەکە .

تێبینی / دەتوانرێت بەپێی ئاستی تێگەیشتن و فێربوونی قوتابییەکەو جیاوازیی کەسی ، زیاتر یان کەمتر لەوەی کە بە پێی تەمەن بۆی دانراوە، پێی بگوترێتەوە.

## قوتابی ئازیز بەسەرئەم هێڵانەی خوارەوە دا بچۆرەوە

















قوتابی ئازیز بەسەر ئەم هێڵەی خوارەوەدا بچۆرەوەو بیگەیەنە بە سەرچاوەکەی.



## ئـاگـادارییەك بـۆ مـامـۆستایانی بـەرێـز:-

پرۆسەی فێربوونی سەرکەوتوو بەندە بە فێربوونی ئەم ( ٣٢ ) پیتەی زمانی کوردی، بۆیە ئەگەر لەسەرەتادا قوتابی کێشەی هەبێت لەفێربوون و ناسینەوە و نووسینەوەی پیتەکان و زوو چارەسەر نەکرێت، لەدواییدا دەبێتە کێشە و بارگرانی لە وانەکانی تردا. بۆیە داوات لێدەکەم ئەی مامۆستای بەرێز پەلە نەکەیت لە وتنەوەی ئەم ( ٣٢ ) پیتە . داوات لێدەکەم لەسەرخۆبیت تاکو قوتابی بە جوانی فێریان دەبێت .

| بۆیە قوتابی زیرەك ( ٣٢ ) پیت بزانی ١٠٠٪ | قوتابی ناوەند ٢٠ - ٢٥ پیت |
|---|---|

بزانێ لەدوایی لەوانەکانی داهاتوو چارەسەربکرێ بەمەرجێ مامۆستا پیتەکان دەست نیشان دەکات و تۆماری دەکات . ناوی قوتابی + ئەو پیتانەی کە نایزانێ .

**قوتابی لاواز ئەوقوتابییە کەلە ( ٢٠ ) پیت کەمتردەزانێ و نابێ بەهیچ شێوەیەك بچێتە قۆناغی دوو پیتی .**

(دەبێ مامۆستا دووبارە پێداچوونەوەی بۆبکات بەمەبەستی فێربوونی پیتی زیاتر)

# پـيـت

## پيتەكانى زمانى كوردى ژمارەيان ( ٣٢ ) پـيـتـن

بە دووقۆناغ دەخوێندرێن . قۆناغى يەكەم :-( تەنيا بۆ لەبەركردن )

قۆناغى دووەم :-( ناسينەوە . خوێندنەوە . نووسينەوە . ڕێنووس )

### قۆناغى يەكەم : كۆمەڵەى يەك پيتى

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئـ | ە | ا | ب | پ | ت | ج | چ | ح | خ | د |
| ر / ڕ ١٢ | ز ١٣ | ژ ١٤ | س ١٥ | ش ١٦ | ع ١٧ | غ ١٨ | ف ١٩ | ڤ ٢٠ | ق ٢١ | ک ٢٢ |
| گ ٢٣ | ل / ڵ ٢٤ | م ٢٥ | ن ٢٦ | هـ ٢٧ | و ٢٨ | وو ٢٩ | ۆ ٣٠ | يـ / ی ٣١ | ێـ / ێ ٣٢ | ٣٢ |

بۆ لەبەركردن لەماوەى ( ٥ تا ٧ ) ڕۆژ

هەڵسەنگاندن :-دواى تەواو بوونى هەردوو قۆناغەكە. مامۆستا هەڵدەستى بەتاقيكردنەوەى گشت قوتابيان، گەر قوتابى توانى ( ٣٢ ) پيت بناسێتەوەو بخوێنێتەوەو بنوسێتەوەو ڕێنووسيان بكا. ئەوا لەئاستى ناياب دايەو. بەسێ قوناغ هەڵسەنگاندنى بۆ دەكرێ ( يازدە پيت ) جارەک گەر نەيزانى بە پێی ئاستەكەى لەلاى مامۆستا تۆماردەكرێت بەم شێوەيە : نموونە

| ناوى قوتابى | ئەم پيتانەى كە نايانزانێ | ژمارە |
|---|---|---|
| هەڵبەست شوان | غ – خ – ق – پ - ش | ٥ پيت |
| هەڵدێر ئازاد | ژ-گ – ج- ف | ٤ پيت |

## قۆناغی دووەم : - ماوەی ( ١٥ - ٢٠ ) ڕۆژ دەخایەنێ بە گوێرەی پێویست

**کۆمەڵەی ( یەک پیتی ) چۆنیەتی :- ناسینەوە -خوێندنەوە - نوسینەوە - ڕێنوس**

**شێوەکانی :- سەرەتا.........ناوە ڕاست ..........کۆتایی**

ئ ە ا ب پ

ئـ ـئـ ـە ـا بـ ـبـ ـب پـ ـپـ ـپ

ت ج چ ح خ

تـ ـتـ ـت جـ ـجـ ـج چـ ـچـ ـچ حـ ـحـ ـح خـ ـخـ ـخ

د ر ڕ ز ژ

ـد ـر ـڕ ـز ـژ

س ش ع غ ف

سـ ـسـ ـس شـ ـشـ ـش عـ ـعـ ـع غـ ـغـ ـغ فـ ـفـ ـف

ڤ ق ک گ ل

ڤـ ـڤـ ـڤ قـ ـقـ ـق کـ ـکـ ـک گـ ـگـ ـگ لـ ـلـ ـل

ڵ م ن هـ و

ڵـ ـڵـ ـڵ مـ ـمـ ـم نـ ـنـ ـن هـ ـو

وو ۆ ی ێ

ـوو ـۆ یـ ـیـ ـی ێـ ـێـ ـێ

تێبینی : ١- پیتی ( لا ) پێکهاتووە لە ( ل + ا = لا ) ٢- پیتی ( ك = ک ) پێویستە مامۆستا ئەمانە بۆ قوتابیان ڕوون بکاتەوە .

## ڕاهێنان

ئەو پیتانەی کە دەیانزانی بە ڕەنگی ( سەوز) بۆیەیان بکەو. هێمای (✓) لەژێری دابنێ.

بەڵام ئەو پیتانەی نایانزانی بەڕەنگی ( سوور) بۆیەیان بکەو . هێمای ( × ) لە ژێردابنێ

ئـ ه ا ب پ

ت ج چ ح خ

د ر ڕ ز ژ

س ش ع غ ف

ڤ ق ک گ ل

ڵ م ن هـ و

وو ۆ یـ ی ێ

ێ

کۆی گشتی ڕەنگە سەوزەکان . =

کۆی گشتی ڕەنگە سوورەکان . =

## ڕێنمایی تایبەت بەنووسینەوە

پێویستە لەسەر فێرکار هەفتەی جارێ.یان دوو جار لەووڕزی یەکەمدا ئەم ڕێنماییانە بۆ قوتابیەکانی ڕوونبکاتەوە.لە هەمانکاتدا بەدواداچوون بکات بۆ ئەوەی ئەنجامی چاکی هەبێت.

١- دەبێت مامۆستا شێوازی گرتنی ( پێنووس ) فێری قوتابی بکات وپێی بلێت نابێ زۆر بەتوندی پێنووس بگرێ. چونکە دەبێتە هۆی ئازارداني پەنجەکان و بێزاربوون و ماندوبوونی قوتابییەکە .

٢- نابێت پێنووس زۆر بەتوندی دابگرێ چونکە دەبێتە هۆی شکانی نووکی پێنووسەکە .

٣- نابێت قەبارەی نووسین زۆر گەورە بێت، یان زۆر بچووک .دەبێت ناوەندی بێت.

٤- نابێت نووسینەکە زۆر تۆخ، یان زۆر کاڵ بێت.دەبێت ناوەندی بێت.

٥- دەبێت نووسینەکە بەڕێکی و بەڕاستی لەسەر هێڵی دەفتەر بنووسرێ بەهیچ شێوەیەک لار نەبێت. دەبێت بۆشایی لە نێوان وشەکاندا هەبێت.

٦- لەکاتی نووسینەوەدا نوقتە ( خاڵ ) و فاریزە بەجوانی لەشوێنی خۆیدا بنرێ .

٧- لەکاتی نووسینەوەدا دەبێت قوتابی ( بە بێ دەنگی ) لەدڵی خۆیدا وانەکە بخوێنێتەوە. بۆ ئەوەی فێری نووسین و خوێندنەوە بێت لەیەک کاتدا.

٨- وریابە لەکاتی نووسینەوەدا قسان مەکە وخۆت بەشتی دیکەوە سەرقاڵ مەکە ،چونکە دەبێتە هۆی دواکەوتن لەنووسینەوەو کاتت بەفیرۆ دەڕوات.

٩- شوێنی دانیشتن :- نابێت شوێنەکە زۆر گەرم، یان زۆر سارد ، یان تاریک ، یان شوێنێکی خراپ بێت، چونکە قوتابییەکە ئازاردەدات.

١٠- دەبێت شێوەی نووسینی پیتەکان لەشێوەی ڕەسەنی خۆی بچێت.

# بەشی دووەم

# وشـــەســازی

## دروستکردنی وشەی دوو پیتی تاکو وشەی دە پیتی



# کۆمەڵەی وشەی (دوو پیتی )

١- د + ۆ = دۆ


٢- ش + ە = شە


٣- ڕ + م = ڕم


٤- م + ل = مل


٥- ک + چ = کچ


٦- ق + ژ = قژ


٧- د + ڵ = دڵ


٨- پ + ێ = پێ


٩- ز + گ = زگ


١٠- ڕ + ێ = ڕێ


١- دۆ ٢- شە ٣- ڕم ٤- مل ٥- کچ ٦- قژ ٧- دڵ ٨- پێ ٩- زگ ١٠- ڕێ

**ڕاهێنان** ١- نووسینەوە بە پەنجە لە هەوادا ٢- سێ جار نووسینەوە لەسەر دەفتەری قوتابی لەماوەی سێ ڕۆژدا ٣- ڕێنووس ١٠ وشە = ١٠ نمرە

سێ وشەی ( دوو پیتی ) نوێ بنووسەوە

١- ژن = ژ + ن

٢- ....... = ....... + .......

٣- ....... = ....... + .......

راهێنان (٢)

ئەم پیتانە (بەهێڵ )بەیەک بگەیەنە

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١- | ش | ۆ | = | دۆ |
| ٢- | د | ە | = | شە |
| ٣- | ڕ | م | = | ڕم |
| ٤- | ک | ل | = | مل |
| ٥- | م | چ | = | کچ |
| ٦- | د | ژ | = | قژ |
| ٧- | ق | ڵ | = | دڵ |
| ٨- | پ | ێ | = | پێ |
| ٩- | ڕ | گ | = | زگ |
| ١٠- | ز | ێ | = | ڕێ |

راهێنان (٣)

ئەم برگانە بە چ پیتێك دەست پێدەکات پیتەکە لە ژێریاندا بنووسە

ژن - جڵ - لم - ڕم - کز - بێ - زڵ - مو - چل - خێ - پڕ - سم -

شێ - تو - ڕێ - ژێ - لۆ - گڕ - بن - زگ - مل - جۆ - چا - خڕ -

پێ - کچ - سێ - شە - تۆ - گڵ

| | ژ | ل | ڕ | گ | ب | ز | م | ج | چ | خ | ت | پ | ک | س | ش |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ژێ | لم | | | | | | جۆ | | | | | | | |
| ٢ | | | | | | | | جڵ | | | | | | سێ | شە |

# کۆمەڵەی وشەی ( سێ پیتی)



١. م + ۆ + ز = مۆز
١ ٢ ٣ — ١ ٢ ٣

٢. م + ە + ڕ = مەڕ

٣. و + ر + چ = ورچ

٤. ب + ز + ن = بزن

٥. ق + ا + ز = قاز

٦. چ + ا + و = چاو

٧. س + ە + گ = سەگ

٨. غ + ا + ز = غاز

٩. ت + ۆ + پ = تۆپ

١٠. ف + ی + ل = فیل

١ – مۆز ٢- مەڕ ٣- ورچ ٤- بزن ٥- قاز ٦- چاو ٧- سەگ ٨- غاز ٩- تۆپ ١٠- فیل

**ڕاهێنان**

١ – نووسینەوە بە پە نجە لە هەوادا ٢- سێ جار نووسینەوە لە سەر دەفتەر لەماوەی سێ رۆژدا.

٣ – ڕێنووس لە سەر دەفتەری قوتابی ١٠ وشە = ١٠ نمرە

سێ وشەی ( سێ پیتی ) نوێ بنووسەوە



تێبینی / نوسینەوە بە پە نجە لە هەوادا. واتە نووسینەوەی ئەو پیت و وشەو ڕستانەی مامۆستا لەسەر تەختە سپی نووسیونی ( تۆخ کردنەوەی لەلایەن قوتابی لە دوورەوە بە پە نجە )

## ڕاهێنان (٢) پیتە) نادیارەکان) بدۆزەوە و بۆشاییەکان پڕبکەرەوە

| ١ | | ٢ | | ٣ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| م | + | ۆ | + | | = | مۆز |
| م | + | | + | ڕ | = | مەڕ |
| و | + | ر | + | | = | ورچ |
| | + | ز | + | ن | = | بزن |
| ق | + | ا | + | | = | قاز |
| چ | + | | + | و | = | چاو |
| س | + | ە | + | | = | سەگ |
| | + | ا | + | ز | = | غاز |
| ت | + | | + | پ | = | تۆپ |
| ف | + | ی | + | | = | فیل |

**پێناسە :** - وشە :- کۆمەڵە پیتێك کە پێکەوە واتایەکیان هەبێت ، پێی دەگوترێت وشە .

تێبینی / دەبێت مامۆستا ئاگاداری قوتابی بکات کە نابێت لەکاتی نووسین ( وشە لەگەڵ وشەی پاش خۆی ) پێکەوە نوسا بێت یان تێکەڵ بوبێت.
ئەمەش بۆ جیاکردنەوەی وشەکانە لە یەکتری لە کاتی خوێندنەوەدا

# کۆمەڵەی وشەی ( چوار پیتی )

١) نـ + و + ێ + ژ = نوێژ
١ ٢ ٣ ٤



٢) مـ + ا + سـ + ی = ماسی
١ ٢ ٣ ٤



٣) گـ + ڵـ + ۆ + پ = گڵۆپ
١ ٢ ٣ ٤





٤) ئـ + ە + سـ + پ = ئەسپ
١ ٢ ٣ ٤



٥) تـ + ا + و + س = تاوس
١ ٢ ٣ ٤



٦) مـ + شـ + ا + ر = مشار
١ ٢ ٣ ٤



٧) کـ + لـ + یـ + ل = کلیل
١ ٢ ٣ ٤



٨) هـ + ە + ڵـ + ۆ = هەڵۆ
١ ٢ ٣ ٤



٩) پـ + ا + ر + ە = پارە
١ ٢ ٣ ٤



١٠) ڤـ + یـ + ا + ن = ڤیان
١ ٢ ٣ ٤



١-نوێژ ٢- ماسی ٣- گڵۆپ ٤- ئەسپ ٥- تاوس ٦- مشار ٧- کلیل ٨- هەڵۆ ٩- پارە ١٠- ڤیان

**ڕاهێنان ( ١ )** ١- نووسینەوە بە پە نجە لە هەوادا ٢- نووسینەوە سێ جار لە سەر دەفتەری قوتابی لەماوەی سێ ڕۆژ ٣- ڕێنووس ١٠ - وشە = ١٠ نمرە

**سێ وشەی ( چوار پیتی ) نوێ بنووسەوە**

_____ = _____ _____ _____ _____
١ ٢ ٣ ٤

_____ = _____ _____ _____ _____
١ ٢ ٣ ٤

_____ = _____ _____ _____ _____

## ڕاهێنان ( ٢ ) ئەم وشانەی لای خوارەوە هەڵبوەشێنەوە

| وشە | ١ | | ٢ | | ٣ | | ٤ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نوێژ | ن | + | و | + | ێ | + | ژ |
| ماسی | | + | | + | | + | |
| گڵۆپ | | + | | + | | + | |
| ئەسپ | | + | | + | | + | |
| تاوس | | + | | + | | + | |
| مشار | | + | | + | | + | |
| کلیل | | + | | + | | + | |
| هەڵۆ | | + | | + | | + | |
| پارە | | + | | + | | + | |
| ڤیان | | + | | + | | + | |

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم وشە ( تاکانە ) بکە بە وشەی( کۆ )

| وشەی تاک | وشەی کۆ |
|---|---|
| کچ | کچان |
| باخ | ................ |
| ماڵ | ................ |
| شار | ................ |
| کور | ................ |

## کۆمەڵەی وشەی ( پێنج پیتی )

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١) | س | م | ۆ | ر | ە | = | سمۆرە |
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | | |
| ٢) | ک | ی | س | ە | ڵ | = | کیسەڵ |
| ٣) | پ | ش | ی | ل | ە | = | پشیلە |
| ٤) | ه | ە | ن | ا | ر | = | هەنار |
| ٥) | ف | ا | ن | ۆ | س | = | فانۆس |
| ٦) | م | ر | ا | و | ی | = | مراوی |
| ٧) | ح | و | ش | ت | ر | = | حوشتر |
| ٨) | ن | ێ | ر | گ | ز | = | نێرگز |
| ٩) | ج | ا | ن | ت | ا | = | جانتا |
| ١٠) | د | ە | ر | گ | ا | = | دەرگا |

١-سمۆرە ٢- کیسەڵ ٣- پشیلە ٤- هەنار ٥- فانۆس ٦- مراوی ٧- حوشتر ٨- نێرگز ٩- جانتا ١٠- دەرگا

**ڕاهێنان (١)** ١- نووسینەوە بە پە نجەلە هەوادا ٢- سێ جارنووسینەوە لەماوەی سێ رۆژ دا ٣- ڕێنووس ١٠ وشە = ١٠ نمرە

سێ وشەی ( پێنج پیتی ) نوێ بنووسە :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ______ | ← | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
| ______ | ← | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
| ______ | ← | | | | | |

## ڕاهێنان (٢) ئەم ( بڕگانە ) بکە بە وشە

| بڕگە | | بڕگە | | وشە |
|---|---|---|---|---|
| هەر | + | مێ | ← | هەرمێ |
| هێل | + | کە | ← | |
| کور | + | سی | ← | |
| پەر | + | دە | ← | |
| پێ | + | ڵاو | ← | |
| دەر | + | یا | ← | |
| ڕوو | + | بار | ← | |
| سا | + | بوون | ← | |
| خور | + | ما | ← | |
| جل | + | شۆر | ← | |

## ڕاهێنان (٣) ژمارە ( ١ ) تاکو ژمارە ( ١٠ ) بە نووسین بنووسەوە:

| ژمارە | | نووسین |
|---|---|---|
| ١ | ← | یەک |
| ٢ | ← | دوو |
| ٣ | ← | |
| ٤ | ← | |
| ٥ | ← | |
| ٦ | ← | |
| ٧ | ← | |
| ٨ | ← | |
| ٩ | ← | |
| ١٠ | ← | |

# کۆمەڵەی وشەی( شەش پیتی)

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | پ | ە | پ | وو | ل | ە | = | پەپوولە |  |
| ٢- | ق | و | ت | ا | ب | ی | = | قوتابی |  |
| ٣- | ز | ە | ی | ت | وو | ن | = | زەیتوون |  |
| ٤- | م | ز | گ | ە | و | ت | = | مزگەوت |  |
| ٥- | گ | ن | د | ۆ | ر | ە | = | گندۆرە |  |
| ٦- | ھ | ە | ن | ج | ی | ر | = | ھەنجیر |  |
| ٧- | پ | ا | ی | س | ک | ل | = | پایسکل |  |
| ٨- | م | ێ | ر | وو | ل | ە | = | مێروولە |  |
| ٩- | ت | ە | م | ا | ت | ە | = | تەماتە |  |
| ١٠- | د | ە | ر | م | ا | ن | = | دەرمان |  |

١ - پە پوولە ٢- قوتابی ٣- زەیتوون ٤- مزگەوت ٥- گندۆرە ٦- ھە نجیر ٧- پایسکل ٨- مێروولە ٩- تەماتە ١٠- دەرمان

**ڕاھێنان (١)** ١ – نووسینەوە بە پە نجەلە ھەوا دا ٢- سێ جارنووسینەوە لەماوەی سێ ڕۆژ دا ٣- ڕێنووس ١٠ وشە =١٠ نمرە

سێ وشەی ( شەش پیتی ) نوێ بنووسەوە.

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ← | | | | | | |
| ← | | | | | | |
| ← | | | | | | |

**ڕاهێنان (٢)** ئەم بۆشاییانە ( بە پیت و وشەی ) گونجاو پڕ بکەرەوە.

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | | وشە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | پـ | وو | ڵـ | ە | = | پەپووڵە |
| قـ | و | | | بـ | ی | = | |
| ز | ە | | | وو | ن | = | زەیتوون |
| | | گـ | ە | و | ت | = | |
| گـ | نـ | | | ر | ە | = | گندۆرە |
| هـ | ە | نـ | جـ | | | = | |
| | | یـ | سـ | ک | ل | = | پایسکل |
| مـ | ێ | ر | وو | | | = | |
| | | مـ | ا | تـ | ە | = | تەماتە |
| د | ە | ر | مـ | | | = | |

**ڕاهێنان (٣)** ئەم وشانە بخوێنەوە و ( ژمارەی پیتەکانیان ) بنووسە.

| وشە | ژمارە | وشە | ژمارە | وشە | ژمارە | وشە | ژمارە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | ٢ | شاخ | ٣ | ماسی | ٤ | ڤیان | ٤ |
| پاداشت | | تو | | فریشتە | | قورئان | |
| غاردان | | حەج | | ڕێ | | جێ | |
| ڤیدیۆ | | ڕاستگۆ | | شیر | | ئاو | |
| هاوین | | قازانج | | پاقلە | | دڵ | |
| بەهار | | خورما | | زستان | | ژوور | |
| عاموود | | پیاڵە | | چل | | گوڵ | |

# کۆمەڵەی وشەی (حەوت پیتی)

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | | وشە | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| -١ | م | ا | م | ۆ | س | ت | ا | = | مامۆستا |  |
| -٢ | ئ | ە | س | ت | ێ | ر | ە | = | ئەستێرە |  |
| -٣ | ک | ە | ڵ | ە | ش | ێ | ر | = | کەڵەشێر |  |
| -٤ | س | ە | م | ا | و | ە | ر | = | سەماوەر |  |
| -٥ | ب | ا | ی | ن | ج | ا | ن | = | باینجان |  |
| -٦ | ف | ا | س | ۆ | ل | ی | ا | = | فاسۆلیا |  |
| -٧ | م | ل | و | ا | ن | ک | ا | = | ملوانکە |  |
| -٨ | پ | ا | ق | ڵ | ا | و | ە | = | پاقڵاوە |  |
| -٩ | ع | ە | ل | ە | ش | ی | ش | = | عەلەشیش |  |
| -١٠ | پ | ە | ن | ج | ە | ر | ە | = | پەنجەرە |  |

١-مامۆستا ٢- ئەستێرە ٣- کەلەشێر ٤- سەماوەر ٥- باینجان ٦- فاسۆلیا ٧- ملوانکە ٨- پاقڵاوە ٩- عەلەشیش ١٠- پە نجەرە

راهێنان (١) ١ – نووسینەوە بە پە نجەلە هەوادا ٢- سێ جارنووسینەوە لەماوەی سێ رۆژدا

٣- رێنووس ١٠ وشە=١٠نمرە سێ وشەی ( حەوت پیتی ) نوێ بنووسەوە.

| | → | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | → | | | | | | | |
| | → | | | | | | | |
| | → | | | | | | | |

چالاکی : مامۆستا ڕۆژانە داوا لە قوتابییەکانی دەکات . کە لە قوتا بخانە چوونەوە بۆماڵ،نووسینی سەر تابلۆی دوکانەکانی ڕێگای ماڵەوە بخوێننەوە

ڕاهێنان ( ٢ ) لەم ( بڕگانەی ) خوارەوەدا وشە دروست بکە .




تۆش ئەمانە تەواوبکە :




ڕاهێنان ( ٣ ) ناز + دار نازدار

تۆش ئەمانەی خوارەوە تەواوبکە.



١- بەهرە + دار ................
٢- دین + دار ................
٣- خێزان + دار ................
٤- ناو + دار ................
٥- برین + دار ................

# کۆمەڵەی وشەی ( هەشت پیتی )

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | ز | ێ | ڕ | ی | ن | گ | ە | ر | = | زێڕینگەر |
| ٢- | ق | ە | ڕ | ن | ا | ب | ی | ت | = | قەڕنابیت |
| ٣- | د | ا | ن | ە | و | ێ | ڵ | ە | = | دانەوێڵە |
| ٤- | ب | ا | ڵ | ە | خ | ا | ن | ە | = | باڵەخانە |
| ٥- | ئ | ۆ | ت | ۆ | م | ب | ێ | ڵ | = | ئۆتۆمبێڵ |
| ٦- | س | ە | ر | ب | ا | ز | گ | ە | = | سەربازگە |
| ٧- | س | ە | ر | ک | ە | و | ت | ن | = | سەرکەوتن |
| ٨- | پ | ێ | ش | م | ە | ر | گ | ە | = | پێشمەرگە |
| ٩- | ک | ت | ێ | ب | خ | ا | ن | ە | = | کتێبخانە |
| ١٠- | م | ە | ل | ە | و | ا | ن | ی | = | مەلەوانی |

١-زێڕینگەر ٢- قەڕنابیت ٣- دانەوێڵە ٤- باڵەخانە ٥-ئۆتۆمبێڵ ٦- سەربازگە ٧- سەرکەوتن ٨- پێشمەرگە ٩- کتێبخانە ١٠- مەلەوانی

**ڕاهێنان (١)** ١ – نووسینەوە بە پە نجەلە هەوادا ٢- سێ جارنووسینەوە لەماوەی سێ ڕۆژدا ٣- ڕێنووس ١٠وشە=١٠ نمرە

سێ وشەی ( هەشت پیتی ) نوێ بنووسەوە.

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ← | | | | | | | | |
| ← | | | | | | | | |
| ← | | | | | | | | |

## ڕاهێنان ( ٢ ) ناوی گیاندارەکان ( بەهێڵ ) بگەیەنە بەدەنگەکانیان

| | |
|---|---|
| پشیلە | دەلوریێنێ |
| سەگ | دەوەڕێ |
| گورگ | دەمیاوێنێ |
| شێر | دەجریوێنێ |
| بۆق | دەقیرێنێ |
| چۆلەکە | دەنەڕێنێ |

## ڕاهێنان ٣ جۆری ڕەنگەکان لە بەرانبەریان بنووسە.

سوور

# کۆمەڵەی وشەی (نۆ پیتی)

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | | وشە | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | ن | ە | خ | ۆ | ش | خ | ا | ن | ە | = | نەخۆشخانە |  |
| ٢- | ق | و | ت | ا | ب | خ | ا | ن | ە | = | قوتابخانە |  |
| ٣- | ج | ا | ڵ | ج | ا | ل | ۆ | ک | ە | = | جاڵجالۆکە |  |
| ٤- | خ | و | ێ | ن | د | ن | ە | و | ە | = | خوێندنەوە |  |
| ٥- | ف | ڕ | ۆ | ک | ە | خ | ا | ن | ە | = | فڕۆکەخانە |  |
| ٦- | گ | ە | ن | م | ە | ش | ا | م | ی | = | گەنمەشامی |  |
| ٧- | ت | ە | ل | ە | ف | ز | ی | ۆ | ن | = | تەلەفزیۆن |  |
| ٨- | د | ە | س | ت | ە | و | ا | ن | ە | = | دەستەوانە |  |
| ٩- | پ | ە | ڕ | ە | س | ێ | ل | ک | ە | = | پەڕەسێلکە |  |
| ١٠- | ک | ۆ | م | پ | ی | و | ت | ە | ر | = | کۆمپیوتەر |  |

١-نەخۆشخانە ٢-قوتابخانە٣- جاڵجالۆکە ٤- خوێندنەوە ٥-فڕۆکەخانە ٦- گەنمەشامی

٧- تەلەفزیۆن ٨- دەستەوانە ٩- پەڕەسێلکە ١٠-کۆمپیوتەر

**ڕاهێنان (١)** ١ – نووسینەوە بە پە نجەلە هەوا دا ٢- سێ جارنووسینەوە لەماوەی سێ ڕۆژ دا٣- ڕێنووس ١٠وشە=١٠ نمرە

## سێ وشەی ( نۆ پیتی ) نوێ بنووسەوە.

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ← | | | | | | | | | |
| ← | | | | | | | | | |
| ← | | | | | | | | | |

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئاگر + دان ← ئاگردان

تۆش ئەم( وشانەی ) لای خوارەوە وەکو ئەو نموونەیەی سەرەوە لێبکە .

| | | |
|---|---|---|
| گوڵ + دان | ← | |
| شەکر + دان | ← | |
| چا + دان | ← | |
| خوێ + دان | ← | |
| ئـاو + دان | ← | |

## ڕاهێنان ( ٣ ) پێچەوانەی ئە م وشانە بنوسە :

| | | |
|---|---|---|
| ١- سارد | ← | گەرم |
| ٢- خۆش | ← | |
| ٣- گەورە | ← | |
| ٤- زۆر | ← | |
| ٥- درێـژ | ← | |
| ٦- زیرەک | ← | |
| ٧- ڕەق | ← | |

**چالاکی:-** مامۆستا داوا لە قوتابییەکان دەکات کاتێ کە لە قوتا بخانە دەچنەوە بۆ ماڵ لە ڕێگا تابلۆی دوکانەکان بخوێننەوە.

# کۆمەڵەی وشەی (دە پیتی)



| | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | ش | ە | م | ە | ن | د | ە | ف | ە | ر | = | شەمەندەفەر |
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | | |
| ٢- | ڕ | ۆ | ژ | ن | ا | م | ە | ن | و | س | = | ڕۆژنامەنوس |
| ٣- | چ | ا | و | ی | ل | ک | ە | س | ا | ز | = | چاویلکەساز |
| ٤- | د | ە | ر | م | ا | ن | خ | ا | ن | ە | = | دەرمانخانە |
| ٥- | ب | ە | ن | د | ی | ن | خ | ا | ن | ە | = | بەندینخانە |
| ٦- | خ | و | ا | ر | د | ە | م | ە | ن | ی | = | خواردەمەنی |
| ٧- | ی | ا | ر | م | ە | ت | ی | د | ا | ن | = | یارمەتیدان |
| ٨- | ن | ا | ن | ە | و | ا | خ | ا | ن | ە | = | نانەواخانە |
| ٩- | س | ە | ر | ت | ا | ش | خ | ا | ن | ە | = | سەرتاشخانە |
| ١٠- | ب | ە | ن | ز | ی | ن | خ | ا | ن | ە | = | بەنزینخانە |

١-شەمەندەفەر ٢-ڕۆژنامەنوس٣- چاویلکەساز ٤- دەرما نخانە ٥-بەندینخانە ٦- خواردەمەنی

٧- یارمەتیدان ٨- نانەواخانە ٩- سەرتاشخانە ١٠-بەنزینخانە

**ڕاهێنان (١)** ١- نووسینەوەبە پە نجەلە هەوا دا ٢- سێ جار نووسینەوە لەماوەی سێ ڕۆژدا ٣- ڕێنووس ١٠وشە =١٠ نمرە

سێ وشەی ( ١٠ ) پیتی نوێ بنووسەوە.

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ← | | | | | | | | | | |
| ← | | | | | | | | | | |
| ← | | | | | | | | | | |

**ڕاهێنان (٢)** ناوی داواکراو بە ئارەزووی خۆت بنووسەو ژمارەی پیتەکان دیاری بکە

| ناوی داواکراو | ناو | ژمارەی پیتەکان |
|---|---|---|
| ١-ناوی وڵاتێ | کوردستان | ٨ |
| ٢- ناوی گیانداری | | |
| ٣- ناوی ڕووەکێ | | |
| ٤- ناوی چێشتێ | | |
| ٥- ناوی ئامێری | | |
| ٦- ناوی مرۆڤێ | | |

---

**ڕاهێنان (٣)** خواردن ← خواردنەوە

تۆیش ئەمانەی خوارەوە تەواو بکە.

١-گەڕان ← ---------------

٢- نوسین ← ---------------

٣- هاتن ← ---------------

٤- برین ← ---------------

٥- کردن ← ---------------

**چالاكی** مامۆستا داوا لە قوتابیان دەکات کە لە قوتابخانە چوونەوە بۆ ماڵ لە ڕێگا تابلۆی دوکانەکان بخوێننەوە.

| ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| دۆ | مۆز | نوێژ | سمۆرە | پە پوولە | مامۆستا |
| شە | مەڕ | ماسی | کیسەڵ | قوتابی | ئەستێرە |
| ڕم | ورچ | گڵۆپ | پشیلە | زەیتوون | کەڵەشێر |
| مل | بزن | ئەسپ | هەنار | مزگەوت | سەماوەر |
| کچ | قاز | تاوس | فانۆس | گندۆرە | باینجان |
| قژ | چاو | مشار | مراوی | هە نجیر | فاسۆلیا |
| دڵ | سەگ | کلیل | حوشتر | پایسکل | ملوانکە |
| پێ | غاز | هەڵۆ | نێرگز | مێروولە | پاقلاوە |
| زگ | تۆپ | پارە | جانتا | تەماتە | عەلەشیش |
| ڕێ | فیل | ڤیان | دەرگا | دەرمان | پە نجەرە |

| ٨ | ٩ | ١٠ |
|---|---|---|
| زێڕینگەر | نەخۆشخانە | شەمەندەفەر |
| قەڕنابیت | قوتابخانە | ڕۆژنامەنوس |
| دانەوێڵە | جاڵجاڵۆکە | چاویلکەساز |
| باڵەخانە | خوێندنەوە | دەرما نخانە |
| ئۆتۆمبێل | فرۆکەخانە | بەندینخانە |
| سەربازگە | گە نمەشامی | خواردەمەنی |
| سەرکەوتن | تەلەفزیۆن | یارمەتیدان |
| پێشمەرگە | دەستەوانە | نانەوا نخانە |
| کتێبخانە | پەڕەسێلکە | سەرتاشخانە |
| مەلەوانی | کۆمپیوتەر | بەنزینخانە |

ڕاهێنان (سێ جار) نووسینەوە لەماوەی سێ ڕۆژدا

## ڕاهێنان

مامۆستای بەڕێز: ( ٤٥ ) وشە هەڵبژێرە لە کۆمەڵەی ( دووپیتی ) تاکو کۆمەڵەی ( ١٠ ) پیتی،ئینجا لەسەر تەختەی پۆل بە تێکەڵی بینووسەوەوە پاشان قوتابییەکان بەڕیز دوو دوو هەڵسێنەوەوە داوایان لێبکە چاویان بنووقێنن و. بەئارەزووی خۆت ( پێنج ) وشەی جۆراو جۆری بۆ بخوێنەوە . پاشان لە قوتابییەکە بپرسە **ژمارەی پیتەکانی ئەم وشەیە چەندن ؟**

**تێبینی / پرسیار و وەڵامەکان بە زارەکی دەبێت. بۆ ( چوار ) وانە**

**نموونە :-**

١- وشەی ( سەگ ) چەند پیتە؟ ٣ پیت

٢- وشەی ( فانۆس ) چەند پیتە؟ ٥ پیت

٣- وشەی ( هە نجیر ) چەند پیتە؟ ٦ پیت

٤- وشەی ( ئەشکەوت ) چەند پیتە؟ ٧ پیت

٥- وشەی ( سەرتاشخانە ) چەند پیتە؟ ١٠ پیت

# بەشی سێیەم

# ڕستەسازی

**گروپی**

١- ڕستەی دوو وشەیی
٢- ڕستەی سێ وشەیی
٣- ڕستەی چوار وشەیی
٤- ڕستەی پێنج وشەیی

**گروپی**

١- دوو ڕستەیی
٢- سێ ڕستەیی
٣- چوار ڕستەیی
٤- پێنج ڕستەیی



## پێـناســە :-

ڕستـە :-چەند وشەیەکە پێکەوە واتـایەکی تەواو دەبەخشن و لەکۆتـاییدا بە پێی مەبەست هێمای بۆ دادەنرێت.

## نیشانەکانی( هێمای ) ڕستە ئـەمانەن

( . ، ؟ ! )

## تێبینی /

١- بەهۆی ئەم نیشانانەوە دەتوانین ڕستەکان لەیەکتری جیابکەینەوە، بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبن.

٢- مـامـۆستای بـەڕێز، سەرەتـا نیشانـەکـانی ڕستە لە سەرتەختەی پۆل بە گەورەیی دەنوسرێ . مەبەست لێی تەنیا بۆ بەر چاو روونی قوتابییە . بۆ ئەوەی بتوانێ جیاکاری لە نێوان ڕستەکـاندا بکات و بیانزمێرێ . لـە دواییدا هـەنگـاو بـە هەنگاو نیشانەکان ( هێمایەکان ) ئاسایی دەکرێنەوە.

# ڕستەسازی

## گرووپی ڕستەی دوو وشەیی

| | وشە ١ | | وشە ٢ | | ڕستە |
|---|---|---|---|---|---|
| -١ | خودا | + | گەورەیە | = | خودا گەورەیە. |
| -٢ | باران | + | دەبارێ | = | باران دەبارێ. |
| -٣ | ڕۆژێکی | + | خۆشە | = | ڕۆژێکی خۆشە. |
| -٤ | کراسەکەت | + | جوانە | = | کراسەکەت جوانە. |
| -٥ | سوپاس | + | براکەم | = | سوپاس براکەم. |

-١خودا گەورەیە. ٢- باران دەبارێ. ٣- ڕۆژێکی خۆشە. ٤- کراسەکەت جوانە. ٥- سوپاس براکەم.

**ڕاهێنان چالاکی**

-١ ڕستەکان بە پە نجە لەهەوادا بنووسەوە .
-٢ سێ جار نووسینەوە لە سەر دەفتەر لە ماوەی سێ ڕۆژدا.
-٣ڕێنووس پێنج ڕستە = ١٠ نمرە

**دوو ڕستەی ( دوو وشەیی ) نوێ بنووسەوە**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| -١ | ________ ________ . | = | | + | |
| -٢ | ________ ________ . | = | | + | |

مامۆستای بەڕێز:- لەکاتی وتنەوەی ڕستەی ( دوو وشەییدا) تاکو ڕستەی (پێنج وشەیی) وریابە دەبێ (وشەکان) بەڕەنگی جیا لە یەکتری بنووسرێت. ماوە لە نێوان وشەو وشەی دوای خۆی هەبێت. نابێت بە هیچ شێوەیەک وشەکان ماوەی نێوانیان کەم بێ.

## ڕاهێنان ( ٢ ) ئەم وشانەی خوارەوە بکە بە( ڕستە ) و هێمای ( ڕستەی ) بۆ دابنێ

| | وشە ١ | | وشە ٢ | | ڕستە |
|---|---|---|---|---|---|
| -١ | خوێ | ← | سوێرە | = | خوێ سوێرە٠ |
| -٢ | لیمۆ | ← | ترشە | = | |
| -٣ | شەکر | ← | شیرینە | = | |
| -٤ | شەمامە | ← | تاڵە | = | |
| -٥ | بیبەر | ← | تونە | = | |

## ڕاهێنان ( ٣ )

بێدەنگی ← جوانییە = بێدەنگی جوانییە ٠

تۆش ئەم وشانەی خوارەوە بە(هێڵ )بە یەک بگەیەنە و بیانکە بە ڕستە و هێمایان بۆدابنێ.

| | وشە | | وشە | | ڕستە |
|---|---|---|---|---|---|
| -١ | ڕۆژێـکی | | دەبـارێ | = | |
| -٢ | بــاران | | خــۆشـە | = | |
| -٣ | خــودا | | گەورەیە | = | |
| -٤ | کراسەکەت | | براکەم | = | |
| -٥ | سوپاس | | جـوانە | = | |

# ڕستەسازی

## گروپی ڕستەی سێ وشەیی

| وشەی ١ | وشەی ٢ | وشەی ٣ | | ڕستە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١- بۆنی | + سێو | + خۆشە | ← | بۆنی سێو خۆشە . |
| ٢- بولبول | + دەنگی | + ناسکە | ← | بولبول دەنگی ناسکە. |
| ٣- کاشی | + سیرامیک | + لووسە | ← | کاشی سیرامیک لووسە. |
| ٤- جگەرە | + کێشان | + خراپە | ← | جگەرە کێشان خراپە. |
| ٥- ڕێزی | + میوان | + دەگرین | ← | ڕێزی میوان دەگرین. |

١-بۆنی سێو خۆشە. ٢- بولبول دەنگی ناسکە. ٣- کاشی سیرامیک لووسە.

٤- جگەرە کێشان خراپە . ٥-ڕێزی میوان دەگرین،

**ڕاهێنان (١)**

١- ڕستەکان بە پە نجە لە هەوادا بنووسەوە .

٢- سێ جار نووسینەوە لەسەر دەفتەر لەماوەی سێ ڕۆژدا.

٣-ڕێنووس پێنج ڕستە = ١٠ نمرە.

دوو ڕستەی ( سێ وشەیی ) نوێ بنووسەوە.

---------------------- ---------------------- ----------------------

---------------------- ---------------------- ----------------------

## ڕاهێنان ( ٢ )

نوێژی ← بەیانی ← بکە = نوێژی بەیانی بکە.

تۆش ئەم وشانەی خوارەوە بکە بە ڕستە و هێمایان بۆ دابنێ.

١- یەکترتان ← خۆش ← بوێت = 

٢- یارمەتی ← نەخۆش ← بدە = 

٣- پاشی ← تەنگانە ← خۆشییە = 

٤- ڕۆژوو ← باشترین ← دەرمانە = 

٥- ترسنۆک ← ژیانی ← نیە = 

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم ڕستانە هەڵبوەشێنەوە بیانکە بە وشە.

| | | وشە ١ | | وشە٢ | | وشە ٣ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- زانین چرای ژیانە. | = | | + | | + | |
| ٢- ڕۆنی زەیتوون دەرمانە. | = | | + | | + | |
| ٣- ئاو بەفیڕۆ نادەم. | = | | + | | + | |
| ٤- ڕێزی دایکم دەگرم. | = | | + | | + | |
| ٥- بەخشندەیی ڕەوشتێکی باشە. | = | | + | | + | |

# ڕستە سازی

## گروپی ڕستەی چوار وشەیی

| | وشە ١ | | وشە ٢ | | وشە ٣ | | وشە ٤ | | ڕستە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | یادی | + | خودا | + | ئارامی | + | بەخشە | = | یادی خودا ئارامی بەخشە. |
| ٢- | مافی | + | خەڵکی | + | بەباشی | + | بدەوە | = | مافی خەڵکی بەباشی بدەوە. |
| ٣- | قەرز | + | کۆن | + | دەبێ | + | نافەوتێ | = | قەرز کۆن دەبێ نافەوتێ. |
| ٤- | کاری | + | ئەمڕۆ | + | مەخەرە | + | بەیانی | = | کاری ئەمڕۆ مەخەرە بەیانی. |
| ٥- | خراپە | + | مرۆڤ | + | ڕیسوا | + | دەکات | = | خراپە مرۆڤ ڕیسوا دەکات. |

١-یادی خودا ئارامی بەخشە. ٢- مافی خەڵکی بەباشی بدەوە. ٣- قەرز کۆن دەبێ نافەوتێ.
٤ - کاری ئەمڕۆ مەخەرە بەیانی . ٥-خراپە مرۆڤ ڕیسوا دەکات.

**ڕاهێنان (١)**

١- ڕستەکان بە پە نجە لە هەوادا بنووسەوە .
٢- سێ جار نووسینەوە لەسەر دەفتەر لەماوەی سێ ڕۆژدا.
٣-ڕێنووس پێنج ڕستە = ١٠ نمرە.

دوو ڕستەی ( چوار وشەیی ) نوێ بنووسەوە.

١- ________ ________ ________ ________

٢- ________ ________ ________ ________

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆ شاییانە بە وشەی گونجاو پڕبکەرەوە:-

( نافەوتێ ، مەخەرە ، خودا ، مافی ، دەکات )

١- یادی ............... ئارامی بەخشە .

٢- ............... خەڵکی بەباشی بدەوە .

٣- قەرز کۆن دەبێ ................. .

٤- کاری ئەمرۆ ..................... بەیانی .

٥- خراپە مرۆڤ ڕیسوا .............. .

## ڕاهێنان (٣)

وەڵامی ڕاست لە ناو بازنە دابنێ.

١- لە مزگەوت نوێژ دەکات؟ ( گاور - موسڵمان - هیندۆس - جوولەکە )

٢- لە ناو ئاو دەژی ؟ ( چێڵ - ئەسپ - ماسی - کۆتر )

٣- خانووی لێ دروست دەکرێ؟ ( کەتەر - دەرنەفیس - بلۆک - پلایس )

٤- ئەندامی لەشە؟ ( چاڵ - چاو - چایە - چرا )

٥- وڵاتی کوردانە؟ ( هیندستان - کوردستان - عەرەبستان - پاکستان )

٦- مێرووییەکە تەون دروست دەکات؟ ( قالۆچە - جاڵجاڵۆکە - خاڵخاڵۆکە - ئەسپێ )

٧- بۆ مرۆڤ بە سوودە؟ ( شەڕکردن - دزیکردن - درۆکردن - کارکردن )

٨- گیاندارێکە (ژەهر) ی هەیە؟ ( مارمیلکە - کیسەڵ - کرم - مار )

٩- شوێنی فرینە؟ ( دەرمانخانە - نانەواخانە - قوتابخانە - فرۆکەخانە )

١٠- ئاردی لێ دروست دەکرێ؟ ( نیسک - نۆک - گەنم - پاقلە )

## ڕستەسازی

### گروپی ڕستەی پێنج وشەیی

| | وشە ١ | وشە ٢ | وشە ٣ | وشە ٤ | وشە ٥ | | ڕستە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| -١ | موسڵمان + | نابێت + | هەرگیز + | درۆ + | بکات | = | موسڵمان نابێت هەرگیز درۆ بکات. |
| -٢ | مرۆڤی + | دز + | ترسنۆک و + | ریسواو + | ناشیرینە | = | مرۆڤی دز ترسنۆک و ریسواو ناشیرینە. |
| -٣ | کاری + | چاکە + | هەرگیز + | ون + | نابێ | = | کاری چاکە هەرگیز ون نابێ. |
| -٤ | دار + | هەڵبڕە + | سەگی + | دز + | دیارە | = | دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە. |
| -٥ | دەستی + | ماندوو + | لەسەر + | سکی + | تێرە | = | دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە. |

١-موسڵمان نابێت هەرگیز درۆ بکات. ٢- مرۆڤی دز ترسنۆک و ریسوا و ناشیرینە.
٣ - کاری چاکە هەرگیز ون نابێت.٤-دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە.٥-دارهەڵبڕە سەگی دز دیارە.

**ڕاهێنان ( ١ )**

-١ ڕستەکان بە پە نجە لەهەوادا بنووسەوە .
-٢ سێ جار نووسینەوە لەسەر دەفتەر لەماوەی سێ رۆژدا.
-٣ ڕێنووس پێنج ڕستە = ١٠ نمرە.

دوو ڕستەی ( پێنج وشەیی ) نوێ بنووسەوە.

-١ ________ ، ________ ، ________ ، ________ ، ________

-٢ ________ ، ________ ، ________ ، ________ ، ________

## راهێنان ( ٢ )

ئەم وشە پەرش وبلاوانەی خوارەوە ( ڕێک ) بخەرە وە

سەرەتا ژمارەیان بۆ دابنێ دواتر بیانکە بەڕستە .

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- | درۆ ٤ | هەرگیز ٣ | موسڵمان ١ | نابێت ٢ | بکات ٥ | موسڵمان نابێت هەرگیز درۆ بکات . |
| ٢- | ڕیسواو | ترسنۆک و | دز | مرۆڤی | ناشیرینە | |
| ٣- | نابێ | ون | چاک | کاری | هەرگیز | |
| ٤- | سکی | تێرە | دەستی | ماندوو | لەسەر | |
| ٥- | دیارە | دز | سەگی | دار | هەڵبرە | |

---

## راهێنان ( ٣ )

بەئارەزووی خۆت ئەم ناوانە بنووسە .

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١- ناوی سێ جۆرگوڵ بنووسە؟ | ← | گوڵە باغ | گوڵە هێرۆ | گوڵە نەسرین |
| ٢- ناوی سێ وڵات بنووسە؟ | ← | | | |
| ٣- ناوی سێ هاوڕێت بنووسە؟ | ← | | | |
| ٤- سێ ڕەوشتی چاک بنووسە؟ | ← | | | |
| ٥- سێ ڕەووشتی خراپ بنووسە؟ | ← | | | |
| ٦- ناوی سێ میوە بنووسە؟ | ← | | | |
| ٧- ناوی سێ گیاندار بنووسە؟ | ← | | | |

# پێداچوونەوە

(ڕستە سازی دوو وشەیی) تاکو (ڕستە سازی پێنج وشەیی)

## گرووپی دوو وشەیی

١- خودا گەورەیە .
٢- باران دەبارێ .
٣- ڕۆژێکی خۆشە .
٤- کراسەکەت جوانە .
٥- سوپاس براکەم .

## گرووپی سێ وشەیی

١- بۆنی سێو خۆشە .
٢- بولبول دەنگی ناسکە .
٣- کاشی سیرامیک لووسە .
٤- جگەرە کێشان خراپە.
٥- ڕێزی میوان دەگرین .

## گرووپی چوار وشەیی

١- یادی خودا ئارامی بەخشە .
٢- مافی خەڵکی بەباشی بدەوە .
٣- قەرز کۆن دەبێ نافەوتێ .
٤- کاری ئەمڕۆ مەخەرە بەیانی .
٥- خراپە مرۆڤ ڕیسوا دەکات .

## گرووپی پێنج وشەیی

١- موسڵمان نابێت هەرگیز درۆ بکات .
٢- مرۆڤی دز ترسنۆک و ڕیسواو ناشیرینە .
٣- کاری چاکە هەرگیز ون نابێت .
٤- دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە .
٥- دارهەڵبرە سەگی دز دیارە .

**ڕاهێنان** یەک جار نووسینەوە لە ڕستە سازی (گروپی دوو وشەیی) تاکو (گروپی پێنج وشەیی)

